# تێکشکاندن و وردوخاشکردنی کـــۆت وبەنـــدەکـــان ..

-شیخ عبد الله عزام؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف المرسلين

ئێمە کاتێك کە ئاڵای جیهادمان لە پێناو خوای پەروەردگاردا بەرز کردەوە، مەبەستمان ئەوە بووە خوای پەروەردگار لێمان ڕازی بێتو وشەی خوای پەروەردگار بەرز وشەکاوە بێ. یەکێك لە پایەکانی بەرز ڕاگرتنی وتەی خوای پەروەردگاریش - کە مەبەستی شەرعاندنی جیهاد کردنە - لادانی زوڵم وستەمە لەسەر خەڵك.

بۆیە کاتێك کە ڕوومان کردە مەیدانی شەڕی ئەفغان؛ مەبەستی ئێمە ئەوە بوو زوڵم وستەم لە خۆمان لادەین وستەم وزوڵمی سەر برا موسوڵمانە ئەفغانەکانمان بسڕینەوە، تا عوزرێکمان لە لای خوای پەروەردگاردا هەبێتو {عَسَى اللَّهُ أَنْ يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا} - ئومێدە خوای گەورە هێز لە بێ باوەڕان بسەنێتەوە.

**لادانی ستەم:**

**یەکێك لە گرنگترین مەبەستەکانی جیهاد کردن لە پێناو خوای پەروەردگار لادانی زوڵم وستەمە لەسەر خەڵك، تەنانەت شەرع وپەیڕەوەکانی خوای پەروەردگار دایبەزاندوون تەواویان بۆ ئەوە دابەزیون کە دادپەروەری لە زەمیندا بەرقەرار بێتو زوڵم وستەم لەسەر خەڵکی لاچێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** {لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالبَيِّناتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الكِتَابَ وَالمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالقِسْط} **- بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان ڕەوانەکردووەهاوڕێ لەگەڵ بەڵگە و نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکراداو کتێبە ئاسمانەکانیشمان هێنایە خوارەوەکەلەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕوون کردونەتەوەتا خەڵکی بەعەدالەت و دادپەروەریی ڕەفتار بکەن**

**"میزان"یش واتا تەرازوو؛ عەدل ودادپەروەرییە - وەك موجاهید وقەتادە وسددی ئاماژەیان پێکردووە.**

**ئیمامی قەتادە دەفەرموێ؛** (اِعدِل يا ابنَ آدَم كَما تُحِبُّ أن يُعدَلَ لَك، وَأَوْفِ كَما تُحِبُّ أَن يُوفَى لَك، فإِنَّ العَدلَ صَلاحُ الناس) **- چۆن حەزت لێیە خەڵکی لەگەڵتدا دادپەروەر بن ئاوا خۆشت دادپەروەر بە، وەفادار بە وەك چۆن حەز دەکەیت خەڵکی لەگەڵتدا وەفادار بن، چونکە دادپەروەری چاکەو ڕاستەڕێیی خەڵکە).**

**ئەو کاتەی کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم عبدالله ی کوڕە ڕەواحەی نارده خەیبەر بۆ ئەوەی خەراج کۆکاتەوە، جوولەکە برێك خورمای گرانبەهایان پێ بەخشی، تاوەکو هەندێك سووکیان لەسەر بگرێت، عبدالله ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ فەرمووی:** (لَقَد جِئتُكُم مِن

أحبِّ النّاسِ إليّ صلى الله عليه وسلم، وأنتُم أبْغَضُ خَلقِ اللهِ إليّ، وَلكِنْ وَاللهِ ما حُبّي لهُ وَبُغضي لَكُم ليجعلني أن أَجْنَسَكُم حَقَّكُم) **- كە هاتوومەتە لاتان لە لای خۆشەویسترین کەسی سەر دڵمەوە هاتووم، ئێوەش زیاترین خەڵقێکی خوای گەورەن کە ڕقم لێیان بێت، بەڵام قەسەم بە خوا نە خۆشویستنی ئەو ونە ڕقی ئێوە وام لێ ناکات مافتان بخۆم. ئا لەوێ جوولەکە گوتیان:** (بمثلِ هذا قامَتِ السمواتُ والأرض) **- ئاسمان وزەمین ئا بەمەوە وەستاون.**

**بۆیە سەیر نییە خوای پەروەردگار دە ئایەت لە ئاسمانەوە بۆ بەری کردنی کابرایەکی جوولەکە دابەزێنێت کە تۆمەتی دزی کردنی خرابووە پاڵ، وپیاوێکی نوێژکەر وڕۆژووگری مەدینەی پێ تۆمەتبار کات - کە** طُعمة بن أُبَيرِق **یا** بَشير بن أُبَيرِق **بوو - ئەو ئایەتانەی ئەم ڕووداوە لە سوورەتی نیساء دا تا هەتا هەتا تۆمار دەکەن:** {إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الكِتَابَ بِالحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيما} **- ئێمە بەڕاستی قورئانمان بۆ لای تۆ دابەزاندووەتە خوارەوە، سەرتاپای حەق و ڕاستی بەردەوامە، بۆ ئەوەی دادوەری بکەیت لە نێوان خەڵکیدا بەو شێوەیەی کە خوا نیشانی داویت و ڕێنموویی کردویت ونەکەی بەرگری لە ناپاکان بکەیت.**

**ئەم بەسەرهاتەش لە مرۆڤایەتیدا داستانێکە بێ وێنەیەو، بە تەنها دەوەستێت وشایەتی ئەوە دەدات کە ئەم قورئانە وشەی خوایەکی داناو شایستەی سوپاسەو، ناکرێ مرۆڤ دەستیان تێیدا بێ، چونکە مرۆڤ - هەر چەند دیدی بڵند بێتو ڕۆحی ساف وسروشتی ڕاستو دروست بێت - ناتوانێ خۆی بەم ئاستە بڵندەوە بگەیەنێت کە خەتێك لە درێژایی ئاسۆدا دەکێشێتو مرۆڤایەتی ناکرێ وناتوانێ - لە ژێر سێبەری ئەم دینەو لە ڕووناکی ئەم مەنهەجەدا نەبێت - پێی بگا.**

بەسەرهاتەکەش بە کورتی لە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتانەدایە؛ کە چەند نەفەرێکی ئەنسارِ بوون - قەتادەی کوڕی نوعمان وریفاعەی مامی - لەگەڵ پێغەمبەردا لە یەکێك لە شەڕەکانیدا بوون، لەوێ سپەری یەکێکیان دەدزرێت - کە ریفاعەیە - ئیتر گومان لە کابرایەکی ئەنساری نەوەی ماڵی "بنو أبيرق" دەکرێت، خاوەن سپەر دێتە لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلمو دەفەرمێ؛ (إن طُعمة بن أُبيرق سَرَقَ دِرعي - طوعمەی کوڕی ئوبەیرق سپەرەکەمی دزیوە)، کە دزیش حاڵ ومەسەلەکە دەبینێ دەست بۆ سپەرەکە دەباتو هەڵی دەداتە ماڵی کابرایەکی جوولەکە، کە ناوی "زيد بن السمين"ـە وبە چەند نەفەرێکی عەشرەتەکەی دەڵێت: (ئەوە من سپەرم ون کردووەو هەڵمداوەتە ماڵی فلان، کە بەدواشیدا دەگەڕێن لە ماڵی ئەودا دەیدۆزنەوە، ئێوەش بڕۆنە لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم)، کە چوونە لای پێغەمبەر وتیان: (پێغەمبەری خوا؛ پیاوەکەی ئێمە پێی وایە فلانە سپەرەکەی دزیوە، ئێمەش خۆمان ئاگاداری مەسەلەکە بووین، جا لە بەردەم ئەو خەڵکەدا کابرا بەری بکەو دیفاعی لێ بکە، گەر خوای گەورە بە تۆوە نەیپارێزێت ئیتر تیا دەچێتو دەفەوتێ)، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم زانی سپەرەکە لە ماڵی کابرای جوو دۆزراوەتەوە، هەستا ابن ئوبەیرقی بەری کرد ولەبەردەم خەڵکدا گەردنی ئازاد کرد، کە پێشتریش بەر لەوەی سپەرەکە لە ماڵی کابرای جوو بدۆزنەوە، کەسوکاری کابرا - ئەنسارەکە - هاتبوونە لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وپێیان گوتبوو: (ئەوە قەتادەی کوڕی نوعمان ومامی یەقەی کەسوکارێکی دیندار وپیاوچاکی ئێمەیان گرتووە، بێ هیچ بەڵگەو بیانوویەك بە دزی کردنی تۆمەتبار دەکەن).

قەتادە دەفەرمێ: (هاتمە لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وقسەم لەگەڵ کرد)، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (یەقەی ماڵێکت گرتووە بە دینداری وپیاوچاکی باسیان دەکەنو، بێ بەڵگەو بیانوو بە دزیت تۆمەتبار کردوون)، قەتادە دەفەرمێ: (هاتمەوەو تەمەنام دەکرد بڕێکی ماڵ وسامانم لە قیس چووبا بەڵام باسەکەم لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم نەکردبایەوە، ریفاعەی مامم هاتە لام وگوتی: برازام چیت کرد ؟ منیش ئەوەم پێ وت کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم پێی گوتم، مامم گوتی: الله المستعان -

خوای گەورە پشت وپەنامان بێ، ئیدی زۆری نەبرد تا خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند: {إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الكِتَابَ بِالحَقِّ ...} )

ئەو چەند ئایەتە لە هەستیارترینو وردترین كاتەكانی كۆمەڵی موسوڵمان دابەزینە خوار، كە جووەكان تیری ژەهراویان نەهێڵابۆوە لەم دینەی نەگرن، خەنجەرێك نەبوو دەستی بۆ نەبەن وهەوڵدەن ئەم سەركردایەتییە خوداوەندانەیەی پێ بكوژن، كە لەم مەنهەج وپەیڕەوەدا وەك واقیع ورەفتار ورەوشت دا خۆی نواندبوو.

ئەم ئایەتانە لە كاتێكدا دابەزینە خوار كە جووەكان تەلەو تۆڕی خۆیان دابەستبوو وتیری خۆیان ئاڕاستەی كۆمەڵی موسوڵمان كردبوو، بۆ ئاژاوەو فیتنەو پەرتەواز كردن ولەت لەت كردنی ئەم كۆمەڵە.

هەر جوولەكەش بوون كە عەقڵی داڕێژەر وئەو دەستە گڵاوە بوون كە لە پشت پەردەوە مونافیقانیان دەجووڵاندەوەو، ئەو دڵ نەخۆشانە - مونافیقەكان - نینۆك ودەستەوانەی گڵاوی دەستی جوولەكە بوون كە دەیانهاوێشتن.

ئا لەو كاتە؛ ئەم ئایەتانە دێنە خوار كابرایەكی جوولەكە بەری كەن كە بە زوڵمەوە بە دزی تۆمەتبار كرابوو، وتۆمەتەكە دەخەنە پاڵ ماڵە ئەنسارێك، كە جێی متمانەی پێغەمبەر بوون وئەوەی هەیانبوو ونەیانبوو لە پێناو سەرخستنی ئەم دینەو پاراستنی ڕووەك وتۆوی ئەم دینەیان بەخشیبوو، ئەم ئایەتانە هاتنە خوار بۆ ئەوەی دزییەك لە ماڵی ئەنسارییێكدا تۆماركەنو، بەمەش شمشێرێكی تیژی تازە بخەنە نێو دەستی جوولەكەوە تانەو تەشەری پێ لە ئەنسارڕ وپشتیوانانی ئەم دینە لێ بدەن.

مەسڵەحەت وبەرژەوەندی سەر تەرازووی مرۆڤ دەیگوت نەدەبوا ئەو پرسە ئاوا هەڵدرابایەوەو گەرم کرابا، بە تایبەتی لەو کاتەو لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، دانایی وسیاسەت وای پێویست دەکرد حەیای کابرایەکی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە نەبرێتو، بۆ کێ ؟ بۆ جوولەکەیك کە شەو ورۆژی بۆ دژایەتی ئەم دینەو هەڵگرانی ئەم دینە کردۆتە یەك.

ڕێز وئیحتیرام لە عورفی خەڵکدا وا بوو کە پیاوێکی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەو لەبەردەم خەڵکی مەدینەدا ئاشکراو فەزح نەکرێت، ئەوەش نا بەڵکو بە درێژایی ڕۆژگارەوە باسەکەی لە قورئانێکدا دابەزێت شەو ورۆژ بخوێنرێتەوە، حاڵ وباری کۆمەڵی موسوڵمان وبەرژەوەندییەکانی لەو قۆناغە سەختەدا لە دیدی کورتی مرۆڤ دا وای پێویست دەکرد؛ چاو لە ڕووداوێکی ئاوا داپۆشرێتو نەکرێتە شەکری مەجلیس وبنێشتی سەر دەمان.

بەڵام مەسەلەکە تەنها ئەوەندە نەبوو پیاوێکی بێ تاوان بەری بکرێت، ئەگەر چی کە سەلماندنی بێ تاوانیی تۆمەتبار کراو وحەق دانەوەی کابرای مەزڵووم لە تەرازووی خوای رەحماندا قورس وگەورەیە، بەڵام پرسەکە زۆر لەوە گەورەترە.

مەسەلەکە سەلماندنی پەیڕەوێکی خودایانەیە کە لەسەر پایەی دادپەروەریدا دامەزراوەو کۆمەڵی موسوڵمان سەرەتا لەسەر خۆیی ئەنجام دەدات پێش ئەوەی لەسەر خەڵکی تردا بیهێنێتە جێو، کۆمەڵی ئیماندار لە ماڵ وخوێنی خۆی هەر حەق ومافێك بێ ئەیدات پێش ئەوەی حەق لە بەرامبەرەکەی بسەنێتەوە.

دەبێ پەیڕەوێك بسەلمێنرێت هەواو ئارەزوو لارە لارەی پێ نەکاتو، ویست وخواستەکان لە خشتەی نەبەن، پەیڕەوێك کە بە بەرژەوەندی نزیك ونەسەب ودەمارگیرییەوە کاریگەر نەبێ.

ئوستاد سید قطب له تەفسیری "فِي ظِلالِ القُرآن" دا دەفەرمێ: (مرۆڤ ئا لەم لووتكه بڵندەوە له كنار شاخه نزمەكان دەڕوانێتو لەوێ تەواوی ئوممەتانی ڕۆژگاری دێنه بەرچاو، ئا لەوێیان دەدۆزێتەوە، لەو قەراغانە. له نێوان ئەو لووتكه بەرزەو ئەو قەراغه نزمانەشەوە؛ كۆمەڵێك بەردی داكەوتوو دەبینێت؛ بلیمەتی ومشتومڕ وسیاسەت ولێهاتوویی وبەرژەوەندی وڵات ونیشتیمان وبەرژەوەندی جەماعەت وتا دوای ئەو ناو وناونیشانانە، دواتر كه لێیان ورد دەبێتەوە؛ دەبینێ وا كرمیان له ژێرە ! جارێكی تر دەڕوانێتەوەو ئوممەتی موسوڵمان - به تەنیا - له كەنارەوە دەبینێ وا خەریكه ڕێگەی لووتكه دەبڕێتو، لەسەر مەودای مێژوودا پەرتە، چاوی لەو لووتكەیەیه كه ئەو پەیڕەوە نایابه ئاڕاستەی كردووە، كەچی ئەو بۆگەنەی ئوممەته جاهیل ونەفامەكانی كۆن وئێستاش كه نێویان ناوە "دادپەروەری"؛ پێویست ناكا لەم كەش وهەوا پاكەدا پەردەیان هەر لەسەر هەڵدەینەوە).

لادانی زوڵم وستەمی سەر خەڵك پیشەی پەیامبەرانە، كه ڕۆحی ئەمینی ئاسمانی بۆ دابەزیوەو شەریعەت وكتێبەكانی بۆ هێنراونەته خوار، سازانیش لەگەڵ زوڵم وستەمو قبووڵكردنی سەرشۆڕی وسەرنەواندنی مرۆڤ بۆ ئاگری بەندایەتی، هاوەڵی كوفرە، پێشتریش ئیمامی شافیعی فەرموویەتی:

أنا إن عِشتُ فلستُ أُعدَمُ قوتاً

ولَئِن متُّ فلستُ أُعدَمُ قَبرا

كه له ژیاندام ڕزقم لێ نابڕێ پەیدایكەم

كه مردیشم هەر قەبرێك دەبێ تێیدا بنێژرێم

هِمَّتي هِمَّةُ الملوكِ وَنَفسي

نَفسُ حُرٍّ تَرى المذَلَّةَ كُفرا

**هیممەتم هیمەتی مەلیك وپاشایانەو**

**گیانم گیانێكی ئازادە، زیللەت وسەرشۆڕی بە كوفر دەزانێ**

**ئەو ستەملێكراوانەی لە جیهانیشدا لە ژێر پێی ملهوڕەكاندا دەژین، شایەنی سەرشۆڕی دونیا وسزای قیامەتن؛** {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الملاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِم قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأولئِكَ مَأوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَت مَصِيرا – إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً فَأولئِكَ عَسَى اللهُ أنْ يَعفُوَ عَنْهُم وَكَانَ اللهُ عَفُوَّاً غَفُورا} **- بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەكێشن لەكاتێكدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەكرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو كەچی كۆچیان نەدەكرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن)و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لەكوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز كراو بووین لە زەویدا، فریشتەكان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان و پان و پۆر نەبوو تا كۆچی تێدا بكەن ؟! ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، كە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێكی ناخۆش و ناسازو خراپە - مەگەر ئەوانەیان كە بەڕاستی بێ دەسەڵات و ناتەوان و لاوازكراون لە پیاوان وئافرەتان ومناڵان كە ناتوانن تەگبیرو گۆڕانكاریەك بۆ خۆیان بكەن و هیچ ڕێگەیەكیش شارەزانین بۆ چارەسەرو دەربازكردنی خۆیان - ئا ئەوانە خوا لێبووردن و چاوپۆشی بۆ ئامادە كردوون و خوا هەمیشەو بەردەوام زۆر لێخۆشبووەو زۆریش چاوپۆشی دەكات (مەبەست لە وشەی ـ عسی ـ بۆ هاتنە دی بەڵێنە خواییەكەیە).**

بۆیە ئەو کەسانەی ژێر ئاگری ستەمکاران جێ ناهێڵن وکۆچ ناکەن وبە ژیانی نێو مێگەل ڕازی ئەبن؛ ئەوانە پاداشتیان ئاگری جەهەنەمە، هەر کە خاو بۆوە خوای پەروەردگار ئەوەندەی تر تینی پێ ئەدات.

کە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەش دەزانی سەرت سووڕ دەمێنییەوە لەبەردەمیا.

ئیمامی بوخاری بە سەنەدی خۆیەوە لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ؛ ابن عباس پێی گوتم: (خەڵکێکی موسوڵمان لە سەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لەگەڵ موشریکاندا بوون ژمارەو عەدەد وسەوادیان زیاد دەکردن، کابرا تیری پێدەکەوت ودەیکوشت، یا لێی دەدرا ودەکوژرا، ئیتر خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ المَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِم ...} ).

ئەمە بۆ ئەو بڕوادارانەی لە مەکەدا بوون وەك پارچە سکڵێك ئەو دینەیان لە دەست گرتبوو، ئەی ئەوانەی لە وڵاتی خۆیاندا دەژینو وەك ئاژەڵ دەخۆن ودەخۆنەوەو لە پارووی نان وپارچە بەرگێك وزیادە مووچەو پلەو پایەیەك فەرمانبەرایەتی وپلەو مووچەو مۆدێلێکی سەیارەو ڕەنگی خانوویەك هیچی تر سەرقاڵیان ناکات دەبێ حاڵ وئەحواڵیان چۆن بن ؟!

ئەوانەی بۆ لادانی زوڵم وستەم وگێڕانەوەی مافی مەزڵوومان ناجووڵێنەوە، ئەوانەن کە نزاو پاڕانەوەی ستەملێکراوان بە گوێ هاواری خوایان لێ دەکەن: {وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالمسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ القَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرا} - ئەوە چیتانەو بۆچی ناجەنگن لەپێناوی ڕەزامەندی خوادا و ڕزگار کردنی لاوازکراوو چەوساوەکان، لەو پیاوان و ئافرەتان و

منداڵانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ڕزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ ساز بکە.

ئەوانن کە زوڵم لە خۆیان دەکەن ودڵیان بۆ ستەملێکراوان ناسووتێت وبۆ لادانی ئەو زوڵم وستەمەی سەریان ناجووڵێنەوە.

بۆیە یەکەم ئایەت کە دابەزیو ڕێی بە شەڕ کردن دا ئاماژەی بە عیلەتی ڕاستەقینەو هۆکاری سەرەکی ئەو شەڕ کردنە کرد، کە لادانی زوڵم وستەمە؛ {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ - اَلَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللهِ كَثِيراً وَلَيَنْصُرَنَّ اللهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللهَ لَقَوِيٌّ عَزِيز} - مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێدەگێرن، کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن چونکە بەڕاستی ستەم لێکراون، بێگومان خوا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێببەخشێت - ئەوانەی کە بەناحەق لە وڵاتیان دەربەدەر کران (تەنها تاوانیان ئەوەبوو) کە دەیانوت: پەروەردگارمان (ألله) یە، خۆ ئەگەر خوا خەڵکی نەدا بەیەکداو حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خواپەرستی جوولەکە و گاور هەیە لە خەڵوەتگە و کڵێساو کەنیسە، هەروەها مزگەوتانیش کەناوی خوای زۆر تێدا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێت، سوێند بێت بێگومان خوا ئەو کەسە سەردەخات کە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەواڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێز و باڵادەستە.

ئا ئەو خەڵکانە کەسانێك بوون کە زوڵمیان لێکرابوو وبە ناحەقی لە ماڵ وحاڵیانەوە دەرکرابوون، هۆکاری ڕاستەقینەی دەربەدەر کردنیشیان ئەو تەوحیدەی گەردنیان بوو کە هەڵیانگرتبوو وقوربانیان لە پێناویدا دابوو وهیچ خراپەیەکیان بۆ قەومی خۆیان نەبوو، تاکە

تاوانایان ئەوە بوو کە الله یان بە تەنیا پێ خوداو پەروەردگار بوو، ئەوەش لە لای موشریك وهاوەڵ دانەراندا گەورەترین تاوانە، چونکە یەکخواپەرستی لە دیدی دوژمنانی خوای پەروەردگاردا تاوانێکە خاوەنەکەی شایەنی ئەوەیە لە لانەی منالّی وبێشەی گەنجێتی خۆی دەربەدەرکرێت.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە کە ابن عباس ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ فەرموویە: (کاتێك کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەرچوو لە مەکە، ئەبو بەکر فەرمووی: پەیامبەری خۆیان وەدەرنا، إنا لله وإنا إليه راجعون، ئەوجار بە هەلاکەت دەچن)، ابن عباس دەفەرمێ: (خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ}) ئەبو بەکر ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێت: (جا زانیم شەڕێك لەگۆڕێ هەیە).

{وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ} - یانی خوای پەروەردگار دەتوانێ بەندە ئیماندارەکانی بێ لە شەڕ وکوشتارەوە سەرخات، بەڵام خوای پەروەردگار دەیەوێ بەندەکانی هەوڵ وکۆشش لە تاعەت وپەرستنی ئەودا بدەن.

ئێمەش دەڵێین:

١) فەرزی جیهاد یەکێکە لە گرنگترین ئەو فەرزانەی خوای پەروەردگار لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە لەسەری فەرز کردووین،و بە ئەنجامدانییەوە پەیوەستی کردووین، هەر وەك بە نوێژ وڕۆژوو وزەکات دانەوە پەیوەستین.

٢) بەجێ گەیاندنی فەرزە ئیسلامییەکان وئەنجامدانیان فەرمانێکی خودایی وتەکلیفێکی پەروەردگارە لە ئەستۆی مرۆڤدا، مافێکی سروشتی وفەرمانێکی لۆژیکییەو، لە ڕکەبەر وئاژاوەگێڕ نەبێ کەس دەمە تەقێی لێ ناکات.

٣) ئێمە لە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا ستەممان لێکراوەو لە کەمترین مافەکانمان بێ بەش کراوین، کە تەنانەت ئاژەڵیش لێی مەحرووم نین، مریشك بەو مریشکییەی خۆی کە لە جووجەکانی نزیك دەبیتەوە پڕت ئەدات، پێ بنێیتە سەر کلکی سەگێك یا لەو ماڵە نزیك بیتەوە کە پاسەوانی دەکا گازت لێ دەگرێت‌و، هیچ هێزێك لە زەویدا ناتوانێ ئەوە لە مەڕێك قەدەغەکا پەلەکانی لە جووڵەدا بوەستێنێت کەوا خەریکە گیان دەدات ودوا دڵۆپە خوێنی لەبەر دەڕوا.

ئێمەش لەوە مەحرووم کراوین دەست بۆ ئەو بازووە بەرین کە خەنجەری لێمان تیژ کردۆتەوە سەرمان ببڕێت، قەدەغە کراوین لەوەی لە ساتی ڕۆح دانیشمان دەنگ بەرزکەینەوەو، ئەوەتا دز گەیشتۆتە ژووری خەو وخەریکە دەست بۆ ناموسمان دەبات وماڵ وسامانمان تالان دەکات‌و خوێنمان دەڕێژێ؛ کەچی قەدەغەیە نوقەمان لێبێت وبێزاری کەین ؟

٤) دوای ئەوەی خاك‌و ونیشتیمانیشمان دایە دەستی دوژمنان ومەحروومیان کردین لەوەی بەرگری لە پیرۆزییەکانمان بکەین وناموسمان بپارێزین، مزگەوتی ئەقسا گیراو کەوت - کەچی حەیف ومخابن - دە موسوڵمان نەبوو لە دەوریدا بکەون وبەرگری لێ بکەن ؟

دوای هەموو ئەوە؛ هەوڵماندا ئەو کەسانە کۆکەینەوە کە غیرەت وپیاوەتی وشەهامەتێکیان لە دڵدا مابوو، هەوڵدەین ئەو جوولەکانە بێزارکەین کە بە هێمنی وئارامییەوە چوونە نێو

مزگەوتی ئەقساوە، کەچی ئەویشیان لێ قبووڵ نەکردین وبە هێز وتوانا وچەکیانەوە یەقەیان گرتین وڕێیان لە نێوان خۆمان ودوژمنانمانەوە لێ بڕییەوە.

ئەمەش ئەوپەڕی زوڵم وستەم وناعەدالەتی وملهوڕییە.

٥) پاش ئەوەی جیهادیشیان لێ ڕەت کردینەوەو لە فەرزی خۆئامادەکردن وئیعدادیان مەحرووم کردین، تا وای لێهات چەك لە جیهانی عەرەبیدا تاوانێك بێت پشتەملی خەڵکی پێ بگیرێتو، هەر کەس بە تۆمەتی چەك هەڵگرتنەوە قۆڵبەست بکرێت؛ دادگای سەربازی بۆ دابەسترێت وکۆت وبەندی بخرێتە دەستەوەو لە کونجی زینداندا بۆ لێپێچینەوەو لێپرسینەوەدا ونی بکەن، نە خۆری بێتە بەرچاو ونە ڕووناکی ببینێتو، نە باوك ونە کوڕ ونە ڕەفیق وبرادەرێك هیچی لە بارەوە بزانن.

کە بەوەش ڕازی نەبووین لە ژێر قاچی تاغووتاندا بە ستەملێکراوی بمرین وبەرگی زەلیلی وسەرشۆڕیمان لەسەر شان فڕێداو، خەجاڵەتمان لەوە کێشا دروشمی بریقەدار وئاواتی پان وبەرین بەرزکەینەوە کە چی خۆمان لە زەلیلی وسەرشۆڕی بەندەو بەردایەتی دابین؛ بڕیارمان دا پشت لەو خاکە بکەین کە جیهادی تیا قەدەغەیەو تاوان وجورمە.

وەك موتەنەبی دەفەرمێ:

إذا كُنتَ تَرضى أَن تَعيشَ بِذِلَّةٍ

فَلا تَستعدن الحُسامَ اليَمانِيا

کە بە ژیانی زەلیلی ڕازی بوویت

ئیتر شمشێرت بۆ چییە بە خۆتییەوە هەڵگری !

وَلا تَسْتَطيلَنَّ الرِّماحَ لِغَارَةٍ

ولا تَسْتَجْدِيَنَّ العِتاقَ المِذاكِيا

**نە ڕمی درێژ بۆ شەڕ وشۆڕ هەڵگرەو**

**نە ئەسپی جوان وچاکیشت بێ**

فَما يَنْفَعُ الأُسْدَ الحَياءُ مِنَ الطَوى

وَلا تُتَّقى حَتى تَكونَ ضَوارِيا

**کە شێر برسیی بوو وبە حەیاو شەرمەوە دانیشت، حەیا چی بۆ بە چی دەکات ؟!**

**تا توند وبە گورز نەبێ کەس لێی ناترسێ ..**

**ئەگەر خوای پەروەردگاریش "نەسیء" بە ڕۆچوونی زیاتر لە کوفر وخوانەناسیدا ناو بنێت - کە دەستکاری کردنی ئەو مانگانەیە کە جەنگ تیایاندا حەرامە، بۆ کاتێکی تر - دەبێ چ ناوێك لەو کەسانە بنێین کە ناویان لە جیهاد ناوە "تاوانی یاسایی"و، سزای ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا بێ هیچ ترس وحەیاو لەرز وخەجاڵەتێك ڕادەگەیەنن ؟!**

**ئایە حوکمی شەرعی ئەو کەسانە زۆر سەختتر وتاوانیان زۆر لەوانەیتر گەورەتر نییە کە قودسیەت وحورمەتی مانگە حەرامەکانیان ڕادەگرتو ڕەچاویان دەکرد ولە عەدەدی ئەو مانگانەدا خۆیان لە حەرام وقەدەغەکراوەکان نەدەدا، بەڵام عەرەب - بە هۆی حەماسەت**

وخوێن گەرمی وپەرۆشییان بۆ شەڕ وجەنگ وئارام نەگرتنیان لە شەڕ وکوشتارەوە - حورمەتی مانگی موحەرەمیان بۆ مانگی صەفەر دوادەخست.

ئەگەر کابرای "کنانة" - کە بە "قلمس" ناسرابوو یا دوا ناوی أبو ثمامة بوو - هەموو ساڵ لە وەرزی حەج کردندا بوەستێت وبڵێت: (أبو ثمامة وەڵامی نادرێتەوەو عەیبی لێ ناگیرێ)، پاشان بڵێ؛ (ئەوە من حورمەتی موحەرەمم بۆ صەفەر دواخست).

ئەوە قەدەغەکردنی جیهاد کوفرێکە کە خاوەنی لە میللەتی ئیسلام دەردەکات، دژایەتی کردنی دۆست ویاوەرانی خوای پەروەردگار وراوەدوونانیان لە وڵاتداو ژماردنی هەناسەو نەفەس ولێدانی دڵیان ودەم بەستانەوەیان؛ کارێکە یەکجار گەورەیە لە لای خوای پەروەردگاردا کە وڵات وخەڵك ومەردم بە هەلاکەت وتیاچوون دەگەیەنێت.

نابینی کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە مەکە وەدەرنرا ئەبو بەکر ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ فەرمووی: (ئەوە پەیامبەری خۆیان وەردەرنا - إنا لله وإنا إليه راجعون - ئەوجار بەهەلاکەت دەچن).

ئەمەش حاڵی ئەو کەسانەیە کە دۆست ویاوەر وئەولیای خوای پەروەردگار وبانگخوازانی ڕێبازەکەی وەدەر دەنێن: "وَمَن عادى لِيْ وَلِيّاً فَقَد آذَنْتُهُ بِالحَرْب" - هەر کەسێکیش دژایەتی دۆست ویاوەرو وەلییەکی خۆم بکات، ئەوە شەڕ وجەنگم پێ ڕاگەیاندووە.

جا ئەبێ شەریعەتی ئیسلامی چ حوکمێك بەسەر ئەو کەسانەدا بدات کە جیهاد قەدەغەو حەرام دەکەن ؟ زینا کردن بە هونەر، وریبا بە سوود، وئیسلام بە دواکەوتوویی، ودەست گرتن بە دینی خوای پەروەردگار بە توندڕەوی ولادان ناو دەبەن ؟!

خوایە پێگیر وجێگیرمان بکەیتو، خوایە یاریمان بدەیت یادت کەینەوەو سوپاس گوزارت بین وبە ڕێکوپێکی بتپەرستین وعیبادەتت بکەین.

خوایە خۆت ئاگاداری کە زۆرداران ستەمیان لێ کردووین وئێمەش قبووڵمان نییە سەرشۆڕی لەو دین ودینداریيەمان دا قبووڵکەین، وهەرگیز بەو فیتنەو کوفرەوە ڕازی نابین کە دەیانەوێ بەزۆر بەسەرمانیدا بسەپێنن.

وسبحانك اللهم وبحمدك، أشهدُ أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

گۆڤاری جیهاد، ژمارە ٣٣

ذو الحجة/ ١٤٠٧ کۆچی



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧